# ١٠ دانــه هــۆکاری خۆڕاگــری بــۆ ئەهلـی غوربـەت و جیهـاد

به پێنووسی: حازیمی میسڕی

# بۆچی

-إن شاء الله-

## بڕیارم داوه له شام دا بمێنمەوه؟


وەرگێڕان و ئامادەکردنی
پێگەی گزنگ

t.me/Gizing_Net
له بڵاوکراوەی کتێبخانەی جیهادي
jhadma.wordpress.com

1437
2017
1396

بۆچی

# بڕیارم داوە لە شام دا بمێنمەوە؟

-إن شاء الله-

## ١٠ دانە هۆکاری خۆڕاگری بۆ ئەهلی غوربەتو جیهاد

بە پێنووسی: حازیمی میسڕی

١٤٣٩-٢٠١٧

# بۆچی بڕیارم داوه له شام دا بمێنمهوه؟

-إن شاء الله-

**به پێنووسی: حازیمی میسڕی**

---

## ١٠ دانه هۆكاری خۆڕاگریو پێ قایمی ئههلی غوربهتو جیهاد

ئهبو عوبهیدهی كوڕی جهراح وهختانهكی ڕۆمی لێ كۆبووبوونهوهو مهترسی تهنگی بۆ هێنابوو، نامهیهكی بۆ عومهری كوڕی خهتاب ڕهوانه كرد –خوایان لێ ڕازی بێ-، عومهریش -ڕهزاو ڕهحمهتی خوای لێبێ- نامهیهكی بۆ نووسییهوهو بۆی ڕهوان كرد، لهوێدا دهفهرمێ:

"ئینجا له پاشان؛ ههر تهنگیو ناڕهحهتییهك ڕێ به عهبدهكی ئیماندار بگرن، خودای گهوره له دواییدا دهرگای خێری لێ دهكاتهوهو ڕزگاری ئهكا؛ یهك سهختیش بهسهر دوو خێرو فهڕاحیدا تێناپهڕێ، خودای گهورهش له كتێبی خۆیدا فهرموویێتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} [آل عمران: ٢٠٠] - ئهی ئهوانهی كه باوهڕتان هێناوه خۆگربن و خۆڕاگریی و ئارامگریی بهسهر خۆتاندا بهێنن، نهبهزن له خۆگری مانهوهتان له سهنگهردا، ههوڵ بدهن ههمیشه له سهنگهری خهبات و كۆششدا بن، له خوا بترسن و پارێزكاربن بۆ ئهوهی سهرفرازیی بهدهست بهێنن". [١]

---

[١] (ئیمامی مالیك له كتێبی مُوَطَّأ دا گێڕاویێتییهوه).

من بۆ چی بڕیارم داوە لە وڵاتی شام دا بمێنمەوە خوا ویستی بێ؟

## ١- بە نیەتی رِباطو سەنگەرنشینی:

(یەك ڕۆژ سەنگەرنشینیو ئێشك‌گری لە ڕای خوادا، لەم دنیایەو هەرچی لەم دنیایە هەیە باشترێکەو .. شوێنو مەوزعی دارو قەمچی هەر یەکەتان لە بەهەشتدا، لەم دنیایەو هەرچی لەم دنیایەش هەیە باشترەو .. بەندە کە دەمەو بەیانی لە ڕاهی خودا دەرەچێ، یا دەمەو ئێواران دەرچێ؛ لەم دنیایەو لە هەرچی لەم دنیایە هەس باشترەو لە بۆی خێرترە) ئەم فەرموودەش فەرموودەیەکی دروستەو هەموومان ئەیزانین!

"مرۆڤیش لە سەنگەردا بە مەبەستی جیهاد کردن لە ڕای خودا بمێنتەوە، لە مانەوەی لە مەکەو لە مەدینەدا باشترەو، نەمزانیوە کە زانایان لەمەڕ ئەمە لە نێو خۆدا هیچ ناکۆکیو خیلافێکیان بێ" وەك شیخ الإسلام ابن تیمیة لە (مَجْمُوعُ الفَتَاوَى: ٢٧/٥١) باسی کردووە.

چاوەڕوانکردنی شەڕو جەنگیش خۆی ریباتە... مانەوەشت لەو سەنگەرەی کافران ئەتۆقێنێتو پێی ناڕەحەت ئەبن هەم ریباتە... مانەوەیشت لە شام دا بەو نیەتەی ململانێی کافران بکەیت ریباتە... دانیشتنیشت لە هێڵەکانی پاسەوانیدا ریباتە، (دەمەو بەیانیو دەمەو ئێوارە دەرچوونێکیش لە ڕای خودا، لەم دنیایە هەر چی لەم دنیایە هەیە باشترێکە) ئیمامی بوخاری گێڕاویتییەوە.

(هەر عەبدێکیش لە ڕای خودا پێیەکانی تۆزاوی بن، هەرگیز ئاگریان پێ ناگا) ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە.

دەی کە لە ئەرزی جیهاد نەمایت، ئاخۆ لە کوێ پێیەکانت تۆزاوی بن؟!

## ٢- بۆ ململانێی کافران‌و خەفەتبارکردنی مونافیقان:

برای خۆشەویستم؛ گەر پرسیارێکت لە خۆکرد: ئاخۆ لە گۆڕەپانی جیهادی شام دا بمێنمەوە -با ڕۆڵێکی بن‌دیوارو پەراوێزیشم بێ‌و، تۆ بڵێ هەر هیچ ڕۆڵێکیشت نەبوو- کافران نارەحەت ئەکا، یا پێی دڵخۆش ئەبن؟ چ ئەو کافرانەی ناوەوە؛ کە نوسەیرِی‌و، بەعسی‌و، ڕافیزەن‌و... چ کافرانی دەوروبەری ئەو ڕژێمە تاغووتی‌و حوکمەتە کوفرییانەو، چ کافری نێودەوڵەتی ئەمریکاو ڕووسیاو، بگرە دەزگا هەواڵگری‌و، زوڕنا ژەنەکانی میدیاو، لەشکرو سوپاکانیان‌و، گروپە بەکرێگیراوەکان... هتد.

بێ گومان هەر خودی مانەوەت ململانێیەکە بۆ ئەو کافرانەو مایەی خەفەتی ئەوانە. ئەم مانەوەیە هەر بۆ خۆی کارێکی خێرە. تۆ هەر لە شەو وڕۆژتا .. لە خەوا، لە ئاگاییتا .. بەڵکو تەنانەت لە وەختی بێ ئیشی‌و گاڵتەو گەپ‌و یاریشدا... خەریکی کاری خێریت‌و، پاداشتێکی مسۆگەرت چاوەڕێیەو، بڵێی دەسکەوتێکی ساردو خۆش بێ! خوای گەورەی میهرەبان لە فەزڵی خۆیمان بێبەش نەکا.

دەی توخوا کەسێك هۆشیار بێ‌و عەقڵی خۆی لەدەست نەدابێ، چۆن پشت لەو فەزڵە دەکات‌و هیچ ئەرزشی بۆ دانانێ؟!

## ٣- وەك مایەی خۆڕاگری‌و پشتگیریکردنی موجاهیدان‌و خەڵکانی مەزڵووم‌و بێ دەسەڵات:

دیارە هەر یەکێکمان -گەر کەمیش بێ- فەزایەکی یەکترناسین‌و پەیوەندی لەگەڵ موهاجیران‌و ئەنسارِی خەڵکی وڵاتەکە هەیە، بۆیە هەر خودی مانەوەت دڵیان ئەداتەوەو، خۆڕاگریان ئەکات‌و، پاڵیان پێوە ئەنێ توندوتۆڵتر بن‌و نەڕووخێن‌و، هەر کەسێکیان دوودڵی ڕووی تێکردبێ؛ تۆ بەم

مانەوەت لێرەدا هانی ئەدەی خۆڕاگر بێ. بەم نیەتەش ئەجرو پاداشتێك بۆ خۆت كۆ ئەكەیتەوە، تەنها ئەو خوایەی ئاگای لە نێو دڵو پەنهانی دەروون هەیە ئەزانێ چەنێك گەورەیە!

لەوانەیە مانەوەی تۆ -هەر تەنها مانەوەكەت- هۆكارێك بێ موجاهیدێكی تازە دیندار نەڕووخێتو پێ قایم بمێنێتەوە، ئیتر ئەبیتە هاوبەشو شەریكی جیهادەكەی.

هەروەك خودی دەرچوونیشت دڵیان دەشكێنێتو، خەنجەرێك لە پشتیان ئەداو، پێی ناڕەحەت ئەبنو، خەڵكی تریشی پێ هان ئەدەیت هەمان ڕێی تۆ بگرنە بەر!

هەر كەسیش لە نەفسی مرۆڤەكان ئاگادار بێو بزانێ سروشتیان چۆنە؛ دەزانێ كاری لەم جۆرە تا چەند كاریگەری هەیەو ئاسەواری چەند گەورەنە. بۆیێ دەبینی لە سوپا كافرەكاندا كەسێك لێیان جیا بێتەوە، یا هەڵبێ؛ لە سێدارەی ئەدەن! پەنا بە خوا ئەگرین نموونەی خراو بین.

## ٤- پاڵپشتییەك بۆ جیهادو پیادەكردنی تەوحیدو سەرخستنی دینی خودا، وە پێی توانا:

هەموو ئاگادارین حاڵی ئوممەتی ئیسلام لەم سەردەمە گەیشتۆتە چ ئاستێكو، چۆنە كە لەم زەمینە هیچ كافرێك نەمایتەوە دەستی بۆ درێژ نەكردبین؛ تەنانەت بێ ئەرزشترین سینفی كافران! پیاویان كوشتینو، شەرەفو ناموسی ئافرەتانیان ئەتك كردینو، ماڵیان ڕووخاندینو، پیرۆزیو موقەدەساتی ئەم ئوممەتەیان لەكەداركردو، بەمەش نەوەستان... بەڵكو ئێستاكانێ ئەوا گۆشتی لاشەمان دەخۆنو منالآنمان بە زیندوویی دەسووتێنن!

دەی کەواتە (منو تۆ) دەستمان لەم ڕێگەیە بەردەین، کێ ھەبێ ئەم تەعەدایە ڕەتکاتەوە؟!

شەرعی خوا لەکارخراوە .. بەڵکو دژایەتیشی دەکرێ ..
تاغووتەکان سواری ملی بێ دەسەڵاتو مەزڵوومان بوونەو، ماڵو منالّی موسوڵمانانیان بە ھەلاکەت بردووە ..
وڵاتی موسوڵمانان کەوتۆتە ژێر شاڵاوی ئیلحادو ھەڵگەڕانەوەو ریدەتو عەلمانیەت... ئەم زەمینەیان بە گەندەڵی وفەساد تەنیوەتەوە ..
خێرو بێری ئەم ئوممەتە فەرھوود ئەکرێ...

پێی ناوێ زۆرت بۆ باسکەم، خۆت واقیعەکە دەزانیو لەمن باشتر ئاگات لێیە!

دەی کە خوای گەورە لێی پرسیت: خۆ دەتزانی، دەی چیت کرد؟! ئەوە ھیوام وایە کە لە ڕێگەی جیھاد دا بوویتو، ئەوەی لە تواناتدا ھەبوو پێشکەشت کرد؛ وەڵامێکت ھەبێ خوای گەورە پێتی ببوورێ... خودا گەورەیەو بە سۆزە... لێخۆشبوو وبەزەییو بە ڕەحمە.

گومانیش لەوەدا نییە ئەم ڕێگەیە ڕێگایەکە نەفسی مرۆڤ پێی ناخۆشە، بەڵام (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ) [البقرة: ٢١٦] - جەنگ لەسەرتان بڕیار دراوە کە شتێکی گرانە لاتان.

خوای پەروەردگار ڕەحم بە سستیو بێ دەسەڵاتیمان بکاتو، لە کەمکاریمان خۆشبێتو، کاروبارمان بخاتە ڕێو، بە سۆزی خۆی لەگەڵمان بکاتو، خراپەکانمان داپۆشێ.

## ٥- بۆ ئەوەی لە فیتنە دووربینو دینداریمان سەلامەت بێ:

چونکە هەموو بەدیلەکان خەراترن!

زۆربەی ئەو موهاجیرانەی وا قەرارە شام بەجێبێڵن، لە نێوان دوو هەڵبژاردەدان؛ کە هەردووکیان فیتنەن بۆ دینداریو خۆدانە نێو کۆمەڵە ڕێگەو دەشتو دۆڵێکی بێ ئاسۆی پڕ لە تەمو مژییە... یاخود هەر بەرەو هەڵدێر چوونە!

یا ئەوەتا ئەو خەڵکە دەگەڕێنەوە وڵاتەکانی خۆیان؛ ئیدی لەوێ زیندانیو زەلیلیو ژیانی بەردەیی چاوەڕێیانە! ئیمامی بوخاری کە کتێبەکەی خۆی دەنووسێ، کۆبەندێك تۆمار دەکاتن بە ناونیشانی: (کۆبەندی ئەوەی کە ڕاکردن لە فیتنە دینداربیە)! بەڵام سەیرە بەڕاستی کەسێك بە دەستی خۆی خۆی فڕێداتە ژێر حوکمی تاغووتو، دوای کە تووشی فیتنەو بەڵا هاتو دینداریيەکەی کەوتە مەترسی، بڵێ: ئەوە لە کوێوە تووشم بوو؟! بەڵکو شایەتە ئەو کاتە ئەو بەڵایەی سزاو عقوبەتی خوا بێ!

یا ئەوەیە ڕوو لە وڵاتە عەلمانییەکانی پڕ لە فەسادو بێ حەیاییو کوفر بکەنو، لەوێ وردە وردە دینەکەیان لە قیس چێتو بێ ئەوەی خۆشیان هەست بکەن! مناڵەکان، خێزانیان لێ گوم دەبێتو لە بەر دەستیان ئەڕفێنرێن، کە پێویست بوو لە ئاگرێك بیانپارێزن مرۆڤو سەنگو بەرد سووتەمەنی ئەو ئاگرەن خۆشی دەکەن، خوداش وا ئەمری کردووە!

دوای عیزەتی چەکداری خاکی جیهاد، خۆت لە ژیانێکی بێ مانای بێ مەبەست بگلێنیتو، ئەو بەم خێرە بگۆڕییەوە! وەك مانگایەك بە ئاشەوە بەسرایتەوە، هەر بێیو بڕۆیو ماندوو وزەحمەتی بکێشی، تا بڕێکی بژێوی ئەم ژیانەت بە دەست بێریو، لە شاڵاوی ژیانو غەفڵەتیو باقو بریقێکی بێ کۆتا ون بیت.

سەیرە کەسێك ویستی بێ دینداری سەلامەت بێت‌و، لە فینتە بە دوور بێ‌و، ئاخیرەتی لا گرنگ بێ... قبوولّی بێ لەم حالّەتەدا بژیتن!

## ٦- داوای عاقیبەت خێری‌و پلەو پایەی بەرزی بەهەشت:

کە وەختێکی زۆرمان پێ تێدەپەڕێ‌و، فیتنەو قسەو باس زۆر ئەبن؛ زۆرجار ئەجرو پاداشتی ئەو خەڵکەمان لە یاد ئەچێ کە هەرچۆنێك لە کاتی هیجرەت‌و کۆچیاندا بمرن، یا لە کاتی سەنگرنشینی‌و شەڕ وجیهادی کافران‌و، پاراستنی سەنگەری موسوڵمانانیاندا شەهید بن‌و، هەر یەکەو بێ گومان خاوەن سەنگەری خۆیەتی... ئەو ئەجرەمان لە بیردەچێ کە هەیانە چەند گەورەیە...

هەموو دەڕۆین .. سبەی بێ یا پەنجا ساڵی دی؛ هەردوو یەك شتە! لە جیهاد ڕاکەیت نە سوودت پێ دەگەینێت‌و، نە ڕووشی تێکەی عومرت کورت دێنێ! شمشێریش پیاو نەکوژێ خۆ بە شتێکی دی هەر دەمرێ! ئیدی با پیاو تەماشاکا عاقیبەتی بە چی ئەبێ، جا (هەر کەسەی لە ژیانیدا لە خاکی ترس‌و وەحشەتدا بمێنتەوەو ئەو ژیانە هەڵبژێرێ‌و دینی خودای پێ عەزیزکات، کە دەخرێتە نێو گۆڕەوە پاداشتەکەی لەوێ ئەوەیە ترس‌و وەحشەتی ئەو ژینەی لێ لادرێ) [شَرحُ السِّيَرِ الكَبير: ١/٩].

برا خۆشەویستەکەم؛ سەنگەری خۆت توند بگرەو، ئێ ئەوەی خوای پەروەردگار بە ڕەحمی خۆی چاوەکمان لێ بکات‌و بە عاقیبەتی خۆشبەختیمان بگەینێ... ئەوەش سەرکەوتنی مەزنە.

## ٧- بۆ هانای خەڵکی لاوازو بێ دەسەڵاتو، بڕێك لە باری لێقەوماوانو ئەهلی حاجەت کەمکەینەوە:

ئەو خەڵکە بە زمانحاڵیان لەم دونیایە چاوەڕێتن، چاو هەڵئەبڕن؛ لە قیامەتیش بە زوبانیان لێت دێنە جواب؛ ئەو دایکە جەرگ‌سووتاوە .. ئەو هەتیوە گوم بووە .. ئەو نەخۆشە بێ دەسەڵاتە .. ئەو زیندانییەی لە ژێر ناڵەی ئازارو ئەشکەنجەو عەزابدایە .. ئەو ناموسە بریندارە؛ ئێمەت بۆ کێ بە جێ هێلا؟ ئێمەت بۆ چی بە جێ هێلا؟! ئەوکاتە با وەلامێکت بێ ڕوونو ڕاستەڕێ، پرسەکە سەختەو مەسەلە گەورەس!

بەڵام کە مایتەوەو ئەوەی کە لە تواناتدا بوو پێشکەشت کرد -با کەمیش بێ- هیوام وایە عوزری خۆتت گەیاندبێو، لەو دۆزە مەزنە ڕزگاربوبیت؛ خوای پەروەردگار ئێمەو ئێوەش لەو ڕۆژەدا پەنا بدا کە منالی کۆرپە تیایدا سەریان سپی ئەبێ!

## ٨- بە نیەتی مەشقو ڕاهێنانو خۆئامادەکردن:

ئەوەی -بە فەزڵو منەتی خوا- لە شامدا بەردەستە؛ لە سەربازگە ئەڵێیتو لە خولەکانی ڕاهێنان، ئەوەی ئێمە ئاگاداربین لە هیچ جێگایەکی دی نایەتە دەست.

بڕێك هەوڵدەیتو بگەڕێیت، دەتوانی مەشقێکی باش لە جۆرەها چەکی جیاوازدا ببینی؛ لە دەمانچەوە تا تانكو .. لە قەناسەوە تا تەقەمەنیو .. لە هاوەنەوە تا راجیمەو .. لە دژەزرێپۆشەوە تا دژەفرۆکەو... ئەوەی لە مەشقدا فێری دەبی بۆت ڕێکدەکەوێ بە شێوەیەکی عەمەلی ممارەسەی بکەیتو؛ زانیارییە تیۆرییەکانتو، توانا جەستەییو دەروونییەکانتو، کاریگەری چەکەکانو، سیفەتو شێوەی شەڕو، تەکتیکەکانی جەنگ تاقیبکەیتەوە...

ئەهلی کوفریش هەر یەکەیان تەمەنێکی خۆی لە کۆلێژە سەربازییەکان بەسەردەباو، ساڵانێك لە کەسوکاری ئاوارە دەبیٚو لەم سەفەرە سەربازییە بۆ ئەو سەفەر؛ تا بڕێك لەو زانستانە بە دەست بێنیٚ؛ تۆش لێرە لەبەردەستدان بیٚ بەرامبەر ئەوجا پشتیشیان لیٚ دەکەی!

تۆ ڕاستگۆ بووی لەگەڵ خودا، تا خودایش بەو ڕاستگۆییەت مامەڵەت لەگەڵ بکاتو وەپێی ئەو ڕاستگۆیەی خۆتەوە ئەوەی ویستووتەو داوات کردووە پێت بدا؟ مەگەر خودا نەیفەرمووە: (وَأَعِدُّوا...) [الأنفال: ٦٠] – ئامادەیی بکەن؟

مەگەر تۆ ناڵێی خۆئامادەکردنو ئامادەسازی فەرزە؟ دەی تۆ لە کویٚو ئەو فەرزە لە کویٚ برای بەڕێزم؟!

خوای پەروەردگار ئێمەو ئێوەش لە ڕاستگۆیی قەولو کردار بیٚبەش نەکا.

## ٩- بە نیەتی بانگەوازو بانگێشتی خەڵکی بۆ خودا:

ئەگەر سەر لە خوتبەو نووسینیش دەرنەکەیتو، بانگخوازو خاوەن وەعزو ئامۆژگاریش نەبی؛ خودی بوونت لە گۆڕەپانی شامدا بانگەوازێکە بۆ ئەو خەڵکەی کە دەتناسنو لە جیهاد دا نین.

هەر ڕێکردنت بە ڕێوە، بەو ڕوخسارە ئیسلامییەوە؛ بانگەوازێکە بۆ خەڵکی غەیرە دیندار.

شەهیدبوونیشت –ڕۆژێکی– پڕماناترین بانگەوازە بۆ تاوانبار تەوبە بکاو، بۆ ئەو کەسەی کە دانیشتووە لە ماڵێدا ڕوو لە جیهاد بکاتنو، کابرای بیٚ ئاگا بێتەوە خەبەر.

کە لەگەڵ موجاهیدان لە وڵاتی شام دا هەیتو سەبووری خۆت ئەدەیتەوە، ئەم نیەتەت با لە یاد بیٚ.

خوای پەروەردگار شەهید بوونێك بە نسیبی ئێمەو ئێوەش بکا، گوناهەکانمانی پێ بسڕێتەوەو لە فیردەوسی بەرزی بەهەشتدا بێ لێپرسینەوەو بێ سزادان نیشتەجێمان کا.

## ١٠- وەفای بەڵێنو پەیمانو ئەو ئەمانەتەی لامانە:

موسوڵمانیش وا پێویستە بۆ پەیمانو بەڵێنی خۆی بە وەفا بێ. بەڵێنیش هەر ئەوە نییە کە نووسرابتەوە، بەڵکو پەیمانە ماناییەکانیش هەر پێویستیان بە وەفایە.

ئەوەتا کابرای شەهید -چەندە شەهید ئەناسیتو، چەند خۆشەویستت بە دەستی خۆت ژێر گل خستووە؟!- مەگەر بۆ ئەوە خوێنو گیانی لە ڕای خوا نەبەخشیبوو تۆ ڕێگاکە تەواوکەیتو بەروبوومی بگریتەوە؟

مەگەم بە مانا پەیمانێك نییە پێویست وایە وەفادار بی بۆی؟

مەگەر زیندانیو ئەسیران بۆ ئەمە نییە ئارامیان گرتووە؟ هەر ئەمە نییە ماڵو موڵکی بۆ سەرفرکراوەو، چەکی بۆ لەشان کراوەو، هەوڵو تەلاشی بۆ دراوەو، کاتو ساتو قوربانیو فیداکاری بۆ کراوە؟!

ئەمە هەمووی بەڵێنو پەیمانو ئەمانەت نین خوای پەروەردگار لێمان بپرسێتەوە ئاخۆ پاراستمانن، یا بزرمان کردن؟

خوای پەروەردگار خۆڕاگرمانکاتو عاقیبەتمان بە خێرکا.
وآخر دعوانا أن الحمد لله ربّ العالمين.

